نامۆ

پەیامی سەوزی عەشقیٚ لەنێو چـــــاوانی تـۆدا
گوڵی نەورۆزی ژینی لە سینەی دەشت و کـۆدا
سەراپـا تەونی ژینم بەدەست تۆ هـــەڵوەشاوە
خەمی عەشقت مقەستی لە تەون و تان و پــۆدا
وشەی خەمباری شێعرم بەدووتا چەندە گــریان
کەچی نەتکرد نیگایەک بە کــۆڕی شین و رۆدا
گوڵی زەردت لەسەر لێو ڕووابوو هاتیە گوڵشەن
بزەت تەوس و توانجی لــە پشکوتنی چـــرۆدا
لە ڕێبــــازی ئەوینت دڵم شووشـەی شکـاوە
وریابە نەبڕیٚ  پەنجەت لە کاتی هاتو چــــۆدا
کە تۆ کۆشکی بەڵێنیت بە بێوەفایی ڕووخـــاند
گوڵی راستی پڕووکـــا لە نێو جـــاڕی درۆدا
شەوەو بەو شارە نامۆم بە تەنیا جێم مـــەهێلە
گەرووی عەشقم ئەتاسیٚ لە نێو قاقای چەقۆدا

## حاجی لەک 1376

### بڕیار

پێی بڵێن شانە نەکا پەرچەمی پڕ پێچ و گـــــرێ
ئەوە لانەی دڵی مانـــدووەمە دەبا تێک نـــەدرێ
گەرهەڵۆی چاوی لەسەر باخی ئەوین دێتە فڕین
سەری پەنجەی لە دڵی مات و سڵم دادەگـــرێ
بە بزەی سەوزی دەم و لێوی بەهاری گـوڵی دڵ
تەمی پاییزی لەســەر باخی ژیـــــان لادەدرێ
هەموو ژان و خەم وئازارە وشەی دەفتەرەکـــەم
بۆیە بەو چەشنە دڵی کیژی غەزەل گڕ دەگـرێ
بە شەپۆلی چەمی ئەسرین لە خەوا ڕادەپـــەڕم
کە وەکوو بەحـــــرێ بە سەر ڕوومەتما ڕادەبرێ

دەرکی دڵ دادەخەم و خەم دەرەوێنم لە سەرم
کەچی ئەوجارە بە دەستی یەکی‌تـر لێی دەدرێ

حاجی لەک **76/2/22**

## خوێنی پێنووس

گەر بچرپێنم خەمی عەشقت بە گوێی کۆسارەوە
لەت دەبێ جەرگیان بەتیخی تیژی ئەو هاوارەوە
ئەو بەهارە گیا لەبیری چۆتەوە هەستێ لە خەو
تـــا بزەی سەوزی گەڵا بڕوێ بە لێوی دارەوە
گەرچی شەختەی پیرە پاییز هەستی ژاکاندووم بەڵام
چاوەڕێی تیشکی هەتاوێکم بە ئاسۆی تارەوە
چۆن غەزەل ڕشپۆش نەبێ و پێنووس نەڕێژێ خوێنی دڵ
کوتری ئاواتی ساوام چۆتە پای سێدارەوە
باوەشی گەرمی خەیاڵ و تیشکی ڕووی شێعر نەبێ
کێ وەهانام دێ بە دەست پەنجەی ڕەشی شەوگارەوە؟

گەر ببینی ئەو شەپۆلەی دێ لە تاڤگەی چاوی من
تێدەگەی چۆنم بە ئێشی زامی بێهەژمارەوە
کێ دەتوانێ پنجی عەشقی تۆم لە دڵ بێنێتە دەر؟
تۆکە باشارت نەکردم بەو هەمۆ ئازارەوە
**1376/11/5** حاجی لەک

باران

*بۆ بارانی ئەمین گەردیگلانی*

قـــــــژی زەوی سەوز بوو بە مــاچی لێوی باران
بزەی هاتێ گەزیزە کــــــە بیستی نێوی بـــاران

به ناز و عیشوه خونچه چارشێوی کـــەسکی لادا
هەتا چاک بێتە گـــــریان دڵی پەشێوی بـــاران
کە دی شەوبۆ دەکێشێ بە سازی ڕێژنە چـــۆپی
هەتاو ڕووی خۆی حەشاردا لە بن چارشێوی باران
وەنەوشە گرژ و مۆنە وسەری گـــرتۆتـــە باوەش
دەڵێ بۆچی بـــەرەو من خـــۆ نابزێوێ بـــاران
بەرەو ئامێزی دەریا کـــەوتۆتە ڕێگـــە ڕووبـــار
هەتا بیباتەوە ئـــەو شەرت و گـــرێوی بـاران
لە چاوی هەوری تووڕە لەبەر چی خـــۆت دزیەوە
بەرەو جێژوانی کام گـــوڵ ڕێگا دەپێوی بـاران؟

1377/1/16 حاجی لەک

## هەڵوەرین

بەخـــــــەم پەرپەڕ بووە یەکسەر کتێب و دەفتەری شێعرم
لەتاوت هـــــــەڵپڕووکاون گــەڵای گۆنای پەریی شێعرم
کە بارگـــــەت تێک دەنێی زریان و زستانت بە دوودا دێ

لەدووی کۆچت سەدان خونچە و گوڵی لێ هەڵوەری شێعرم
شنەی سروەی نیگات کاتێ وشەم دەگرێتە باوەش خــۆی
لــق و پـــۆی دێتە گـــوڵ بەو پاییزە داری بەری شێعرم
بە هــەڵبەستا هەواڵم بۆ نەنـــــاردووی چون نـــەیارانم
بەتاوانی ئـــــەوین لەوشارەدا دەبــــڕن سەری شێعـــرم
بە چاوی مشتەری ڕوانیومە بۆ بەژنی گــــەلـێ هەڵبەست
نەبوو هاوتای لەجـــــوانی‌دا کچی ڕەش ئەسمەری شێعرم
بــــزەت گەر بێتە سەر لێـــوو ببێتە دۆی خــــەیاڵی من
زەمـــــاوەندی ئەوین دەگرین هەتا بن سێبــــەری شێعرم
ئەگەر هەر من بسووتێنیێ گــــڕی ئەو عەشقە قــەیناکا
دەتــــــرسم سەربکا و بگاتــــە خـــۆینـەری شێعـــــرم
پەژارەی کـــــۆنی هەڵبەستم دەپشکوێ گـــوڵبزەی لێوی
ئەگـــــەر ڕۆژێ بەتــــەنیا تۆببیتــــە بیسەری شێعـــــرم
1378/6/28

## درۆزن

جەرگی سەوزی بەهـــار خوێنی تێزاوە ئـــەنجن ئـــەنجنە
چون تازەی زانیوە شنـــەش وەکوو زریـــــان درۆزنـــــە

بۆنی خــۆشەویستی نایە لــە بسکی هیچ ئــەستێرەیەك
وشەی دڵناسکی غـــــەزەل رێگەی ئــەوینیان لـێونە
شەپۆلی چۆم دوێ شەو رەدووی گۆلاوی رەش کەوت بۆیە
کانی هەر لەسەرچـــــــاوەدا خەریکی خۆخنکـــاندنە
دەسرەی سەرچۆپی زریانە گەڵا لەسەر تەرمی بەهــــار
شەختەی هێناوەتە ژوانی گەزیزەو سوورە گـــوڵ شنە
قرچەی هــەناوی سێبەری رووحی ماندوومە دێتــەگوێ
چونکـــە ئەمرۆ رۆژی رەشی وادەو بەڵێنی شکـــاندنە
ئەم پەخشانە ناسكو دڵتەڕەی هێلانەی عـــەشقت بـوو
لە شەرمــــــەزاریا ئێستێ بە تاسەی خــۆسووتانـدنە
ئەو پێنووسەی وشەی لە ئەستێرەو هەتاو بۆ دەستانـدی
ئێستا حەزی لە هــــەڵوەرینو چـــاوەڕوانی کوشتنە
سروودی خۆشەویستی بوو لە نێو گەرووی گــەڵای وەریو
دەیگوت ئەم رووباری عەشقە هەر لـــەسەرچاوە لیخنە.
کۆیە ـ بەفرانباری 1383

# داخ

هێند دڵم تەنگە لە دڵتەنگی ئەمن گــریا خەم
دڵ گڕی گرتوە فرمێسکی چلۆن فـریا خـــەم
وشکەساڵێکە و لەبەر خونچە دەرێژم ئـــەسرین
چون دەڵێن دێیەوە با فەڕشی گوڵت بۆ ڕاخـەم
باخەوان گەرچی سەدان بەردی لەشـــاباڵم دا
پەژیوان نیم و ئەویندارێ گـــوڵی ئەو باخـــەم
من لە ئامێزی چیای سەربەتەما گـــەورە بووم
سەر لەبەر کەند و کڵۆ و جەوری زەمان داناخەم
شەختە شمشیری لەسەر گـــەردنی گوڵ داناوە
هێشتە تێر ماچی دەمی گوڵ نەبووم بەو داخەم
تۆ کەجێم دێڵی وەکوو تیشکی هـەتاوی زستان
چۆن ئیتر دەرکی دڵی خۆم لە ئەوین داناخـەم
جێ هەوار خاڵییە و لەو زێدە دەڕۆم یـەکجاری

لێدەنێم باروبنە و تازە لە هیچ کۆیی ناخـــــەم

پاییزی 1379 میاندواو

******

بە بادەی تاڵی مەینەت کاس و گێژم
لە ڕێبـــازی ئــەوین ئەفسانــە بێژم
لە چاوم دا دەبینی کۆلکـــە زێـــرین
لەبەر چاوت کە فرمێسک برێـــــژم؟
کە دەستم ڕانەگاتە خـۆڵی جێـژوان
بە چی چاوی کچی شێعر بـــــــڕێژم
لە گـــــۆڕستانی ژینم جێ نەمـــاوە
حـــەز و ئاوات و تاسەی لـــێ بنێژم

## 1376

# سرتەی خەیاڵ

دوێ شـــەوێ من لێوی ئاڵی تۆم لەخـــــەودا مشتوە
چـــاوی هەڵبەستم بە خـــــاکی ڕێی ئەوینت ڕشتوە
تا نــــەمامی بەرز و سەوزی خۆشەویستیت بێتە بەر
هـــەرچی فرمێسکم هەبوو یەکجاری بۆم هـەڵڕشتوە
گوڵبزەی لێوم دەگەڵ پاییزی کـــۆچت هــــەڵوەری
ژانی دوورییەکەت پەپوولەی پێکەنینمی کــــــوشتوە

قـــۆچەقـــانی چارەنووس چەشنێکی هەڵداشتووم دەڵێی

لـــەو بەڵێنیانــــەی من و تـــــۆ ترســـی زۆر ڕێنیشتوە

با لقی سووری زمـــــانم ڕانــــــەژێنێ ـ با ـ ی خەمت

چـــــونکە باڵندەی سەدان هـــاواری لـێ هـــەڵنیشتوە

نوێژی قەت بەرناکەوێ با ســـەر لە سوژدەی هەڵگـــرێ

ئەو کەسەی وەک من بەخوێن دەسنوێژی عەشقی نەشتوە

دەنگی سەوزی بانگی مزگــــەوتێ لەهەرجێ بێتە گـوێت

دیــــارە پیلانێکی سووریـــان لەبنــــەوە داڕشتــــوە

بۆئەوەی سرتــەی نیگـــا و سروەی ئەوینم بێتە گـــوێ

خۆم لە بێشکـــەی باوەشی شێعــرێکی تەڕ هـــاویشتوە

**1379/12/2** ورمێ

## ڕاوێژی نیگا

جـــامی ژینم تا بەیادی تـــــۆوە لێوڕێژ کـــردووە
تامی عەشق و خۆشەویستیم پڕ بەدڵ چێژ کردووە
هەرچی روخسارت دەبینێ سوژدە بۆ جـــوانی دەبا
کافـــر و بێ دینت فێری تاعـــــەت و نوێژ کردووە
دوێ شەوێ چاویان بە چاوی تۆ کەوت ئەستێرەکان
گاڵتەیان تا ڕۆژ بە ئەستێرەی گـــەلاوێژ کــــردووە
زامی پڕژانی وشەی شێعرم نەدەکـــــرا چـــارەسەر
ئەو برینانـــــەت بە یەک دیـمانە سارێـــژ کـــردووە
دوێنێ رۆژنامـــــەی ژیانم بۆ خـــــەیاڵ دەخوێندەوە
ئەو بەشانـــــەی وا لەگەڵ تۆم دا وتووێژ کـــــردووە

بێ زمانیش چۆن مەبەستی خۆشەویستیت تێ نەگەم
تۆ کە دوو چـــــاوی کەژاڵت فێـرە ڕاوێژ کـــردووە
ڕازی عـــەشقت هێندە پڕ پێچ پەنایــە بۆ شـــەرح
شاعیر و زانا و مـــەلا و شێخی هـــەموو گێژ کردووە
تۆ بە سێرێکی نیگات چـــــاوی زەمانت کــردەخەو
جێت بە هیپنۆتیزم و سەد عیلمی وەها لێژ کـردووە
کیـــــژی شێعرم بۆیە هێندە دڵـڕفێنە و نــــازەنین
چون بە خـــاکی جێژوان چاوانی کل ڕێژ کــــردووە

1380/5/18کەرەج

تۆزی گومان

هـــــەرکە پێم نـــایە جیهان تیشکی هـــەتاوم ون بوو
هـــــەموو وەرزی تەمەنم تـــۆف و تەم و بــــاڕن بوو
دیم لە ئاسۆگـــــی ژیـــان جێیـــەکی رووناک،ئەمـما
گۆشەیەک بوو بە چـرای چاوی گــــورگ ڕۆشن بوو
بەشی من تـــاڵ بوو بـــەری داریژیـــان هــــەربۆیە

ئــارەزووم دیتنی خــەونێکی کــەم و شیــــرن بوو
ژین بەسەرچوو کەچی من نەمدیبزەی تیشکی تاو
ئــاسمانم شەو و رۆژ هـــەور و هــەڵا و چڵکن بوو
چۆم و ڕووبارم ئەدی و ئاویٚ نەبوو ڕوون و جــــوان
چـــووم و دیتم کە لــەسەرچـــاوەکەیا لیخن بوو
من لە شوێنێکی جیهان عاشقی ســەربەستی ببووم
کە لەویٚ باوی وشـــەو شێعر و ئەوین کــوشتن بوو
منم ئەو شــــاعیرە لاسار و خــــەمینەی کە دەڵێن
بــاوەڕی ڕوونی لــــەنێو گۆلــی گـــــومانا ون بوو

کەرەج ـ 1381/10/18

## داوێنی نیگا

گەرچی تیشکی مانگی قەولــی تۆ هەتاکوو سەر نەبوو
دەستی یــادم قــەت لەداوێنی ئــەوینت بەر نــەبوو
دوورلەتۆ شەختەی خەفەت ژاکاندی باخی گــوڵبزەم
خۆدەنا قەت باخی ڕازاوەی غـــەزەل بێبــەر نەبوو
زۆر لەســـەر ڕازی نیگای تۆ شــارەزا دواون بــەڵام

شەرحی عەشقت کاری زانا و شاعیر و نـووسەر نەبوو
تا نیگام دەستی بە داوێنی نیگای مەستت نـــەگرت
شێعری نامۆم شارەزای نێو کاغەز و دەفتـــەر نەبوو
چاو بە فرمێسکن لەدووی کۆچت،وشەی شێعرم کەچی
بۆ پەژیـــوان کـــردنەوەت ئەو شینە کاریگـــەر نەبوو
دوێ وتم چـەپکێ گــوڵت بەدیاری بۆ بچـنم لە بــاخ
هیچ گوڵێ شایانی دەستی کیژی ڕەش ئەسمەر نـەبوو
تا شنـــەی سروەی ئەوین نـــەیدا لە بسکی ئارەزوو
بیری ئــاڵۆزم ئــەوەندە تیـــژ و داهێنــەر نـــەبوو
هەر لەژێر سایەی دڵـــۆڤانیت پشووی دا شێعـــری من
خۆ دەنا داری ژیـــان بۆ شاعیـــری سێبـــــەر نەبوو

1381/5/5 کەرەج

زیارەتی زام
«بۆ شەهید مەنسوور مەعرووفی»

تا وشەم دەست لە قەدی کیژی غەزەل وەردێنن
دەبنە پــڕشەنگـی هــەتاو چۆم و چیا دەدوێنن

کـــانیاو و چـــەم و ڕووبار و هـــەتاو بێ ئوقـــرەن
چـــون بەئەسپایی دەبێ لانکـــــی خـەمێ ڕاژێنن
بۆیە شەو دەستـــی وەها داوەتە دەست بای زریان
تاکـــوو تیریژی هـــــەتاو لێرە بەچـــۆک دابێنن
مانگی خەمناکی خەزەڵوەر دڵـــی گیراوە دەڵێن
پـــۆلـــــێ ئـەستێرە لـە گۆلاوی شەوا بێ شوێنن
چاوەڕێتانە هەتـاو لێرە بە جـــــەرگی کون کون
ڕێـــــژنە ئەسرینی بەســــــەر زامی دڵا بڕژێنن
ئەو درنجانـــــە دژی شیلــــەبزەی ڕوونـــاکین
دڵـــی ئـاوێنە بە بەردی ڕق و قین دەشکێنن
شاخ و کێو هاتوون بۆ زیارەتی زام ئیزنیان دە
سەری کڕنۆشێ لەبەر زامی بەسوێت دانـوێنن
مەرهەمێکم دەوێ بۆ زامی دڵی هـــەڵبەستم
لەشی زاماری وشەی شێعرم شەلاڵی خـوێنن
1381/8/24 بۆکان

# گراو

شاباڵی‌نیگا تا لە وشـــــەی‌شێعرم ئــەساوی
ئەستێرە دەگەڵ مانگ و هەتاو دێنـە سڵاوی
عەشقت کە لە چاوانەوە دەڕژێتە چەمی ژین
هۆنراوە تەزووی سەوزی ئەوین دێتە هەناوی
ئاوێنە کەوێنەی قەد و روخساری ئەتۆی دی
قرچەی دڵی چرژاوی خزی بۆ سەر و چاوی
چیرۆکی ئەوینی مە وەها کردی ڕەگــاژوێ
منداڵ و بەساڵاچوو هــــەموو بوونەتە ڕاوی
جێژوانی شــــەو و رۆژی لە دەوری دەمی تۆیــە
ئــەو شێعرە کە خاڵی چەنەتی بـۆتــە گــراوی
تینــــوێتــــی بــــە بـــارانی ســـرووودێ دەشکێنم
پاش کـــۆچی ڕەشی پـــاییز و زستانی تـــەماوی
لەت لەت لە نیگات هەڵدەوەرین دوێنێ بە لێشاو
شـــوشەی ڕەشی پەیمـان و بەڵێنی بەشکــــاوی
سێوی غـــەزەڵێ بچنـە لـــەداری هـــونەری من
تا شەختە لە پـەلکی گوڵی روخساری نـــەداوی

# گومبەز

پەلکـــــەگیای بێ ئاو و ژاکاوی خـــەمم بەو دێمـەوە
بێ شنـەی سـەوزی نیگـات بەوزووانـــە نابووژێمەوە
ویشکەساڵی گـەرچی شاباڵی شــەپۆلـی شکانـدووم
هــەر بە گـــۆرانی نمەی بارانە هــەڵدەقوڵێمـــەوە
دەست لە مل کێو و ڕەوەز و گۆرانی ئـــەچڕم بۆ بەهـار
هـــاودەمی سروە و شـــەماڵی خۆشەویستی دێمـــەوە
نێوی تۆ شابـــەیتی شێعری کـــەسک و سووری ژینمە
بۆیـە وەک ئــاهـەنگی حــــەیران بێوچان دەیلێمەوە
گـومبەزی مـەمکت پـەرستشگەی دڵی دێـوانەمـــە
وەک موریدی شێت لەدەوریان ڕۆژو شەو دەخولێمەوە

## پەشیمانی

ســـەرەتای پیتی ئەویینداری غـــەڵەت بوو بەسەرت
غـەزەلم بۆیە خەفەت بار و شەکـەت بوو بـەسەرت
ماڵی عەشقت کە لــــەسەر خۆڵی بەڵێن دامـــەزرا
خـــەبەرت بوو دەڕمێ بۆیە پەلەت بوو، بـــەسەرت
شـــەربەتی تـــاڵی پەشیمانی دەنۆشێ ئـــەوی وا
شێتی پەخشانی نیگا و شێعری بزەت بوو، بەسەرت
ئەو دڵـەی بۆنی غەزەل مەست و ئـــەویینداری کرد
بە چەقۆی تیری درۆی عەشقەوە لەت بوو، بەسەرت
ئێستە ژاکاوە بزەی سەوزی گـــەڵای داری ژین
ئەوە هۆی بۆنی ڕەشی وەرزی گزەت بوو، بەسەرت
ماڵی پڕخوێنی دڵم کردە مەکۆی عەشق چـــون
تۆ لەنێو خوێنی دڵا مەیلی مەلەت بوو، بەسەرت
هەر لە سێدارە دەدەی تۆ بە پەتی ڕێـــوە نێگام
چونکە تاوانی چەمم ماچی چەنەت بوو، بەسەرت
لێدە ئـــاهەنگی ڕەشی تـــاڵی جـــودایی شمشاڵ

# شۆڕەسوار

شـــــەو کــە پێی‌نا ســەر دڵی ئاسۆ بەچــاوی مۆڕەوە
شـۆڕەسواری ئاسمــان ڕۆیی بە خـوێنــــە چـــۆڕەوە
شەمشەمە کوێرەی ڕەشی شەوگارپەرست سەرشاخی گرت
پێــم دەڵــێ خــۆری بــزەی لێوت بنێ نێو گـــۆڕەوە
ڕاوچییــەک بــۆنی سروودی دێ لە هــەنگــاو و نیگای
تـاکــو مــاسی بیــر و بـڕواتــان بخـاتـە تـــۆڕەوە
خەج سیامەندی بەجێ هێشت وخەزاڵیش چـەشنی شێت
دەم دەنێتــە نێو بــرینی ســووری لاســە شـــۆڕەوە
پــاییز و زستــان بە خوێنی جەرگی خونچە مەست دەبن
بسکــە بسکیــان دێ بە نــووزە و شیوەن و گــابـۆڕەوە
تـــاکوو کوێستان و ڕەوەز ئــەژنـۆ بگــرنـە بــاوەشیان
ڕێــوی شـای مــەیدانی شێـرانن، بە سـەد مــانــۆڕەوە
پێشکــەشی تـۆ بێ غــەزەل ملوانکــە گــریانی ئـەوین
شینی پیــرۆزە و بە ئــەڵقـەی پێکــەنین مەیگــۆڕەوە

## حاجی لەک ـ 1382

### سێوی غەزەل

هەستە پێنووسی خەواڵوو لادە چارشێوی غــەزەل
بوونە ئیلهامی خــــەیاڵم خاڵی سەر لێوی غــەزەل
بۆ کچی ئیـــوارە شێعری سەر شــەقــامی شارەکەم
من لەداری عیشقی سەوزی تۆم چنی سێوی غەزەل
ڕێژنـــــەبـارانی وشەم بۆ وەسفی چـــاوت دادەکـــا
گەر بپشکوێتن لەسەر دێڕی نیگات نێوی غـــــەزەل
گەر لە کێبڕکێی ئەوینا چـــاوی تۆم لـێ دیارنـــەبا
چۆن لەبەستێنی ئەدەب ببرامەوە گرێوی غــــەزەل
تۆ لە ویشکەساڵەکـــانی ساردی بێ شێعریی زەمان
باڵی سڕبووی سەت شەپۆلـی کانی دەبزێوی غەزەل
خاوەنی خاڵی ڕەشی سەر پەلکــی ڕیحانــە و گوڵی
وا لەخۆبایی دەگەڵ کەس ڕێگــــە ناپێوی غــەزەل

دادەگیرسێنم چرای عەشقم بە سروەی نیونیگـــات
ئەودەمەی لوتکەی چیای ئەو شارە دەنگێوی غەزەل

1382/6/7حاجی لەک

بەهار

دەشت و دەر مەستن لە بۆنی دڵگـــری بادەی بەهـــــار
کـــانیاو گـــۆرانی ئـــەچـــڕێ بۆ کچی سـادەی بەهـــار
ڕادەژێنێ بـای شـــەماڵ دەسرەی هــەزار ڕەنگی سروشت
دۆی گـــەڕی نێو داوەتی وەرزانـــە ســەیزادەی بـــەهـــار
شوێنی شەپڵاخەی ڕەشی شەختەی لەسەر ڕوخساری باخ
کـــردە جیژوانی گـــوڵ و ئـــاوازی بای وادەی بـــەهـــار
چـــەپڵـــەرێـــزانی چلووکـــی دار و دەشت هەر بۆوەیـــە
لەو کەژ و کێوانە تۆزی مـــەرگ و خـــەو ڕادەی، بەهـــار
با هـــەموو بـــاڵندەکـــان بـــاوەڕبکـــەن خـــۆر زیندووە
کـــاتی وەی هـــاتوە تـــەمی بەر ئـــــاسمان لادەی، بەهار

زۆردەمێکـــــە دەشت و دارستـــانی بێکـــەس چـــاوەڕێن
تاکو شاڵی کەسک و متفـــەڕکیان بەسەر دادەی، بـــەهـار
تـــەرکی گـــریانێ دەکـا بولبول بزەی دەخزێتە
گـــەر بـزانێ دەستی ئـــەو دیلانە بـەرنـــادەی، بـــەهـار

**1382/1/24** حاجی لەک

شمشاڵ
پێشکەش بە قالە مەڕە

لە خـــەو ڕابوون کەژ و کۆ دەگـــەڵ هاواری شمشاڵ
ســـــروودی ڕاپـــەڕیـــن بـــوو ڕژا لە زاری شمشـاڵ
خـــەمی حـــەیران و بەیتی گەلێکی گرتـــــە ئەستۆ
شەپۆل ئـــەدا شەو و ڕۆژ چـــەمی ئـــازاری شمشاڵ

دەگەڵ نووزەی بەسۆزی خـــەج و سیامــەندی زامار

بەڕێژنە ئەشکی لێڵی لە چــاو ئــەباری شمشـــاڵ

بوغدان و ئەستێ شینی کــاکـــە میر و کـاکە شێخ

دەڕێژنە نێو هـــەنــاوی چــڕ و زامــاری شمشـــاڵ

دەگەڵ عەبدول عەزیزی خەمینی کوڕلەدەست چوو

دەگێڕێ شین و دەگری دڵی خـــــەمباری شمشاڵ

هـــەوای لاوک و بـــەیتی خـــەزاڵ و ئــەیڕەقیبە

لافـــــاوی دڵ دەکێشێ بـــەرەو هـــەواری شمشاڵ

ئــــەوەی دەگــــەڵ خــەم وژان بە حاستەم ئاشنا بێ

چرۆی خـــەمی دەپشکـوێ بە نــارەنــاری شمشاڵ

ئامێرەکانی موزیک چــاویــــان لە دەستی تــۆیە

لەنیشتمانی دەنگدا سەرۆک کــــۆماری، شمشاڵ!

دەستت خستۆتە ئەستۆی کچی حەیران و بەستــە

خۆزگەم بە تۆ کە دۆستی کەژ و کۆساری، شمشاڵ!

ئەگەر نەبوایە پەنجەی بەهەستی مــامــە قــالــە

بێبەش دەبوین لە چێژی بەر و بوی داری، شمشاڵ

1382/5/9بۆکان

## شەرحی عیشق

تا سەری پەنجەی هەناسەم بۆ قژی تۆ شانە بـــوو
سینگی شێعرم پڕ لــە گۆرانی گـــوڵ و ریحــــانە بوو
تـاسەبــار، بینی بە کـــانیی عەشقـــەوە نــابوو نیگــام
کـــۆتــری مـاچم چلۆوکـــی لێوی تـــۆی هێلانــە بوو
خاڵی لێوت بۆ ژوان چـــاوی لــە شێعــرم دادەگــرت
کەس وەکوو خاڵ بۆ فـــریـــو دانی غەزەل وەستا نەبوو
تیشکی عەشقت تا لــە رێبـەنــدانی ژیندا دەرکـــەوت
خـــاکــەلێوە خـانـــەخوێی روو خۆشی ئەو وەرزانە بوو
شەرحی ئەو رازەی لە سەر دێڕی نیگات دەمخوێندەوە
قـــەت دە نێو تـــەفسیر و راڤـــەی هیچ کتێبێ دا نەبوو
لیزگـــە ملوانکـــەی بزەت تا خستە ئەستۆی شێعری من
کیژی هـــۆنـــراوەم لە نێو دنیـــای غـــەزەل تـــاقـــانە بوو
هەرچی زیاتر شەرحی دەم جوانیی قەسیدەی بەژنەکەت
چـــاتـــرم لێ روون دەبێ ئـــەو شـــەرحە منداڵانـــە بوو
زیـــارەتی بەیتولحـــەرامی مـــەمکی تـــۆم زۆر کردووە

ئەو سەفـــا و مـەروە و تـــەوافانەم ئـــەویندارانـــە بوو
تـــا بە رەحمـــەت نازڵت کـــرد ئـــایـەتی پیرۆزی ماچ
غەیری من پێغەمبەری عەشقێ لە سەر دنیـــا نـــەبوو
چاوی تۆ بەڵگـەی پتـــەومـــە تـــا بڵێم خـــوا شـــاعیرە
چونکـــە هـــەر ئەو شارەزای تەفسیری ئەو شێعرانە بوو
ڕۆژ و شەو دەستم دەخستە مل کچی پەخشانی جوان
تا سەری پەنجـــەی هـــەناسەم بۆ قژی تۆ شانـــە بوو

**حاجی لەک 1383**

## "هەڵقرجان"

بۆ هەولێری شەهید

ڕەشەبا هات و دڵی ناسکی شار هەڵقرچا
نیشتمانی دڵی پڕ خوێنی هەنار هەڵقرچا
پێکەنین سیس بوو لە سەر لێوی هەلاڵە و هێرۆ
گوڵی حەیرانی کەژو دەشت و بەیار هەڵقرچـــــا
شەوی بێ شەرمی دزێو قەڵسەی گێڕا لە گزینگ
خوێنی کازیوە لە پێدەشت و بنار هەڵقرچـــــا
جێژوان بەرگـــی ڕەشی کردە بەری دار و بەرد
چونکە تیریژی نیگـــای چاوی خومار هەڵقرچا
نیشتە سەر لێوی قەل و داڵ و چەقەڵ شانازی
گوڵبزەی گەش کە لە سەر لێوی بەبار هەڵقرچا
زیرەك و ماملێ بگرین کــــە گوڵی گۆرانـــی
پەڕبە پەڕ ئەوڕۆ دەگەڵ تاروقەتار هەڵقرچـــا
شاری بۆکان وەرە دەستت بخە مل هەولێرێ
دڵی سەردارو سەدان شۆڕە سوار هەڵقرچــــا

ئەی سولەیمانی دەگەڵ شاری مەهاباد بگرین
جەرگی سەت دایك و کچی تازیە بار هەڵقرچا
پیلـــی ڕووبار دەبڕن لێرە بە فتوای شەیتان
بۆیە شاباڵـــی بزەی چۆم و کەنار هەڵقرچـــا
شەمشەمە کوێرە وا چـــاوی بە خۆر هەڵناوە
تیشکی ڕۆژ بۆیە بەدەستی شەوی تار هەڵقرچا
دێـــــوی پاییزی لە مێحرابی شەڕا دایبست نوێژ
ســــــەری پەنجەی لقـــی ئاواتی بەهار هەڵقرچا
ڕەشەبای بەدفەڕی فتوایەکی ریش درێژی حەرام
هاتەکوێستـــــــان و حەزی چیمەن و دار هەڵقرچـــا
بۆیە من شینێ کە شایانی شەهید بوو نەمکـــرد
چون زمانـــی قەڵەم و شێعر وتار هەڵقرچـــــــا
" یەکی شوبات"بۆکان

" ======= "

دیاره تۆ سەودات دەگەڵ سروە و شەماڵا کردوە

بۆیە هەستم باوەشی بۆ بەستە واڵا کردوە

خوێنـــــی عەشقی تێگەڕاوە گوڵوشەی پەخشانی من

کێ ئەڵێ پشتم لە چاوو بەژن و باڵا کردوە

پۆست مۆدێڕنن شێعری خاڵ و کورتە چیرۆکی نیگات

بۆیە عالەم ڕووی لە نووسین و موتاڵا کردوە

ئـــەو نیگایەی هێرمنۆتیك شەرح و ڕاڤەی هەر نەکرد

ئیستە تفسیرم لە نێو زانکۆی خەیاڵا کردوە

بـــــووکی هەڵبەستم لە گێژاوی شەپۆلی پەرچەما

هەر مەگیرانیی بە بۆنی سەوزی ئاڵا کردوە

ئایەتـــــی عەشقی دەهێنا دۆینێ جوبراییلی رشووت

بۆیە من دەستم بە کرنۆش و سکاڵا کردوە

83/2/21 کۆیە

## "شنە"

خۆزگە تۆ هەرگیزدڵـــی هۆنراوەمت نەشکـــــــاندبا

با گوڵی ماچی لە سەر باڵی بزەی تۆ چـــــــــاندبا

تاڵ بەتاڵ تەفسیری بۆنی شێعری بسکیتۆم دەکرد

گەر شەوی شوومی سەفەر بەو چەشنە نەیشێواندبا

بەم شەوە تیشکی بزەت نەیگرتبا دەستی غــەزەل

نێو نیشانی ماڵی عەشقی تۆم لە کێ ئـــەستـاندبا

دەفتەری پاراو دەکــرد هـۆنراوە باران گـەر شنـە

شادەماری هــەوری بیری شـــاعیری بزوانــــدبا

دەبووە گەپچاڕی هەموو ئـــەستێرەکانی ئـاسمـان

گەر گەلاوێژ خۆی لە ئاستی چـاوی مـەستت نـواندبا

تۆ کە هاتی کۆتری شێعـری سپیم ئـــاوارە بـــوون

چۆن دەبوو تۆ بێی و من هەڵبەستم هــــەڵنەفڕاندبا

شێعری من رازی ئەوینی تۆی بە ئەستێران دەگووت

گـــــەر شەپۆلی گۆمەشینی چاوت نـــەیخنکاندبا

خۆزگە جارێتر سروودی ســــــەوزی هەنگاوی شنە

هاتبایە و هەستی نووستوومی لە خــــەو هەستاندبا

پەرچەمت ڕێزی هەبوو بۆ تیپی "پێشمەرگە"ی وشەم

تۆ نەدەبووا عاشقی ئالآت لە خوێن گـــەوزاندبا

ئارەزووم وابوو لە دەستم هاتبایە خاڵ بە خاڵ

شێعری نوێی ڕووتم بە کۆڕی شاعیران ناساندبا

کۆیە هاوینی1383/4/15

## ڕازی گەلاوێژ

عەشقێ کە زمان خۆ لە بەیانی خەمی نادا
دەرکەوتووە ئەمڕۆکە لە ڕۆمانی نیگـــادا
کەس نەیدی ژوانی من و ئەستێرە لە شـەودا
نامەی "شنە" بوو رازی "گەلاوێژ"ی بە بادا
تا, پیتێ لە سەر شەرحی ئەوینی تۆ بنووسم
بـارانــــی بە پیتی غـــەزەلی دێ بە دوادا
لێوت کە لە دادگاهی ئەوین ماچی دەدامـــێ
تەفسیری لە سەر پیت و وشەی مافی ڕەوادا
هەر سەوزە بە بارانی بزەت پەلکـــــی بەڵێنیم
قەت شەختە لە شابسکی تەڕی ئەو گووڵە نادا
تا دەستی بە تیرێژی بزەی تۆ وەیە هەستم
لەو ڕەوتە هەتا جوانیی هەبێ ئەستەمە لادا

خـــاڵت کە بزانێ غـــەزەلم زیزە لــــە ڕێوە

مەجبووری دەکا بێ لە هەل و مەرجی وەهادا

هـــەر بۆنی شنەی رستەیەکی نامەبنێری
هاسانە تەمی حەسرەتی ئەو غوربەتە رادا
بۆ کوشتنی ئەستێرە پلانی هەبوو شەوگار
تیشکێکی گەلاوێژی نیگات لێی لە هوڕادا

کۆیە
1383

# "كوێستان"

شێعری خوناوكەی نیگات تا تێكەڵی باران دەبێ
كۆتری بەستەم هەقێتی هۆگری كوێستان دەبێ
گەر بە چاوانی گەشی ئاماژەیەك بكا بۆ زەمان
چەرخی پیری ڕۆژگاریش تووشی راوەستان دەبێ
بەفری ڕوخساری ئەگەر خاڵێكی چووكەی تێكەوێ
ڕوومەتی بێ گەردی كوێستان سەت ئەوەندە جوان دەبێ
دەبمە شای عەشق و ئەوین و خۆشەویستی ئەو دەمەی
نیو نیگای لێوڕێژ لە دڵداریتم لـــێ میوان دەبێ
عەشقی تۆ میداڵی سەوزی گەردنی هۆنراوەمە
بۆیە لەو ڕۆوە لە سەر زاری ئەویندااران دەبێ
جێی پشووی پێشمەرگە شاخەو بەو زووانە دڵنیام
باوەشی كوێستانی نیشتمانی خۆم جێژوان دەبێ

كۆیە1383/5/20

# چوارینــــه

کـــــه هەوری ناسکـــی پێڵوت ئەبزوێ
قەسیدە و شێعری نوێ دەرژێ لە چاوت
دڵــی پڕ خوێنی شێعری هەڵدریوم
لەتی شوشەی بەڵێنی تێک شکاوت

***1382***

خۆزگە یەکەم ڕازی نیگات پڕ لە قین و هەڕەشە با
ناوت زریانێکی دڕی دژ بە پشکوتن و گـــــەشەبا

ئێستا دەماری غەزەلم پڕن لە مەرگێکی نــــــــامۆ
چون دەزانم ڕۆژێ دادێ "شنە" دەبێ بەڕەشـــــەبا

**کۆیە ـ رەزبەری1383**

کەسیرەی کردم ئەو ئێش و کوڵ و ژانەی بەنێوی ژین
وەکوو فیلمێ دەنێو پەردەی تەماوی مانگ و ساڵ دایە
***
وردەخاڵی لاپەڕەی گەردنت بە ریز هـــــاتوونە خوار

چۆن سەرنجم ڕانەکێشن هەر لە شێعری نوێ دەچن

***

کە حوکمی تاڵی تەبعیدم بە مۆری چاو دەکەی ئیمزا

دەگـەڵ ئـازار و ژانی سـەردەمی دووری چلۆن ڕابـێم

***

# گەلاوێژ

شەوگار بە بزەی عەشقەوە دەدوێنێ گەلاوێژ
خونچەی غەزەلی تاسە دەپشکوێنێ گەلاوێژ
بیستومە بە گوێی مانگەشەو و شار و شەقام دا
چیرۆکی ئەویندار‌ی دەچرپێنێ گەلاوێژ
ئەستێرە هەموو چاو لە دەمی شیرینی دەبڕن
تا لێوی گزینگێکی ببزوێنێ گەلاوێژ
شەرحی غەزەلی خاڵی بە من ناکرێ چ بکەم
بەو تیشکە زمانی وشە دەشکێنێ گەلاوێژ
گفتی ئەبەدیم دا بە شنەی سەوزی بەهارێ
جامی تەمەنی قەولم دەچڕژێنێ گەلاوێژ
دەریا بە تەمای شینە شەپۆلێکی نیگای بوو
تا دەستێ بە زولفی حەزی دابێنێ گەلاوێژ
سەت خۆزگە لە ئامێزی شنەی وەرزی ئەویندا
ئازاری خەمی شێعرم بلاوێنێ گەلاوێژ
شێواوە رەدیفم بە بزەی شاغەزەلی خاڵ
بۆو باسە وشە و هەست و عەقڵ کەوتنە راوێژ

کۆیە 83/7/29

# " دەریا 1 "

بەهاری بۆ دڵم دێنا بزەی چاوی گەشی دەریـــا
غەزەل نوێژی ئەوینی خوێند لەبەر خاڵی رەشی دەریا
خەم وژانم لە پەیکی ئاڵی شێعرێکدا بەسەر داکرد
بەڵێنیم دا نەدەم لەو ژانە تۆسقاڵێك بەشی دەریـا
لە حاستی چاوەکانی ئەو سەرم داخستبوو دۆینێ
دەترسام دابرووشێنێ، نیگام کۆڵمەو لەشی دەریـا
کەنارو روخ بەستێنی تـــەنی لێمان کزەی پـــاییز
دەبێ یەکجاری جێ بێڵم بەهشتی باوەشی دەریـا
کە زنجیری وەفای خستۆتە ئەستۆی کیژی هەڵبەستم
لە دڵدا هەر هەڵیدەگرم ئەوینی سەرکەشی دەریـا

# " دەریا 2"

دەباری خۆشەویستی لە دیدەی شینی دەریا

دەڕژایە رۆحی بەستەم رێژنەی ئەوینی دەریا

خەریك بوو دەستی زستان گەرووی هەستی دەبەستم

فریام کەوت بەهاری بزەی بە تینی دەریا

بە دەسرۆکەی شەپۆلی عەشق چۆپی دەکێشا

وشەی پەخشانە شێعرم لــە هەڵپەڕینی دەریــا

شین و شەپۆڕی شێعری شەوانی شوومی غوربت

نەمـان بە دەنگی سەوزی یەك پێکەنینی دەریـا

ببومە خــاك و خۆڵــی رۆخ و کەنــار و بەستێن

کردم لە خۆشەویستی و ئەوین ،پەرژینی دەریا

وەکوو جــاران شەپۆلــی کەزی نادەن بوارم
کە خۆم باوێمە گۆمی سینگی بەرینی دەریا
دەگەڵ دواپین هەناسەی بەهاری خۆشەویستی
دەستــی زریانێك دەمبا بۆ خۆرنشینی دەریــا
دەبینم لێڵە ئیستێ نەینووکی باڵی پێلت
برۆ:با تەرمی هیوا و ئەوین نەبینێ دەریا

" دەریا 3 "

کـــە چاوت بۆ عەشقی چڕی سروودی شینی دەریایی
دوا هەناسەی پەژارەم بوو لە سەر روخساری تەنیایی
دڵۆپێکـــی بزەت ریشەی خەمی هەڵکەند لــە ناخمدا
لـــە خوێنم دا رەگاژۆی کرد ئەوینێکی ئەهورایی
هەتاو کە زیەی تیشکی لە بەر روخساری تۆ شانە دەکرد
کە هاتی مانگ و ئەستێرە کردیان بە گۆوەند و شــــایی
پێنووسەکەم بە بادەی باسی ئەم عەشقە بووە سەرخۆش
رۆحی شێعر کرنۆش ئەبا بۆ بەڵێنی تا هەتایی

که دەم دەنێن بە گۆی مەمکی کانیی خۆشەویستیتەوە

وشەی بیانووگری غەزەل زمـــــان دەگرن بە ساوایی

لــــە ئەنگوستە چاوی شەوی تەنیاییدا بوو تێگەییم

سوژدەی برد بۆ گەلاوێژی گەشی نیگات تـــاریکایی

رازی شینی دەریـــــام بۆ لێکدەداتەوە چاوی گەشت

ئەم چیرۆکە تەنیــــا دەگەڵ مەرگی مندا دێتە دوایی

شەپۆل ئەدا لە نێو سینگی وشەم دا خۆشەویستی تۆ

لە سایەی نیو نیگات راڤەی عەشق ناگاتە کۆتــــایی

ئەگەر چــاوت خەوی دەریای بە مەستی لێك نەداباوە

هەواڵی مەرگی ئەم عەشقەم دەبوو بە شتێکی ئاسایی

## " دەریا 4"

لـــــــەشاری دڵ برۆ دڵ بەجێم بهێڵە دەریـــا

چیتر پێدەشتی هیوام بە خەم مەکێڵە دەریـــا

چەقۆی رەشی ئەوینت پەپوولەی شێعری کوشتم

چاوگەی بەڵێن و وادەت  دەمێکە لێڵە دەریـــا

ئێستاکە شەرمەزارن وشەی پەخشانە شێعرم

هەر چونکە ناوی تۆیان لە سەرتە وێڵە دەریـا

تراویلکەی بزەت بوو لــــــــــەم قاقری ئەوینە

نەیهێشت بزانم دەستی وەفات پڕ فێڵە دەریا

شێعرم دەچێتە شوێنێك وەفا و عەشق لەوێ بن

پێت وانەبێ کە هەروا لە دووی تۆ وێڵە دەریا

خەمبار و توورە ئەم شەو دەفتەر وتی بە پێنووس

توخوا چیدی مەنووسە لە سەر ئەم هێڵە دەریـــــا

85/3/20کۆیە

"دەریا 5"

شینم لەسەر دەگێرێ ئاسمانی چاوی دەریا

قەسیدەی ژینە بسکی تێك  ئاڵۆزکاوی دەریـــا

سروودی ڕوونی تیریَژ  بۆ مانگ و خـــۆر ئەخوێنیَ
پرشەنگی  شێعری سەوزی بزەی تاو تاوی دەریا
دلّـــم بە مەمکی شیری ئازادی فرچکی گـــــــرت
لە نێو شوورەی ئەوین و زیندان و داوی دەریــــا
سەری لووتکەی لە لێوی هەور دەساوی کوێستان
سوژدەی برد کاتیَ بیستی لە شێعرم ناوی دەریا
شنەو ڕووبارو کانی خەمینن وەك دلّـــــــــی من
لە بەر فرمێسکی ڕوونی چەمی گریاوی دەریــــا
قەلّەم ویستا لە شەرحی شەپۆلی شینی چـــاوت
برۆ  و برژانگ و زولفت بۆی بوونە ڕاوی ، دەریـا
دەگەلّ شیلەی ئەوین و مانـــای وشەی قەسیدەم
لەبەژنی بیَ قەراری زەمان هالاّوی ،دەریــــــــا
مەرگ ناتوانیَ ناوت بزر کـــــــــا لێرە چونکیَ
لە نێو خوێنی غەزەل دا حەشارم داوی، دەریـــا

85/8/9 کۆیە

# " شیله بزه "

كه وه‌سه‌ر كه‌وتی له‌سۆی روون و گه‌شی مندالّی
خۆر به‌ برژۆلّــی گزینگ كووچه‌كه‌تـــانی مــالّی
دای له‌ قه‌ندیلی خه‌می ناخم بروسكه‌ی بزه‌یه‌ك
ته‌می سه‌ر روومه‌تی ئیحساسی هه‌موو رامـــالّی
چۆن قه‌سیده‌ی قژی پڕ پێچ و خه‌می راڤه‌ بكه‌م
كه‌ قه‌لّه‌م كۆلّه‌ له‌حاند شه‌رحی وشه‌ی یه‌ك تالّی
یه‌ك دلۆپ شیله‌ بزه‌ت كــه‌وته‌ دلّـــی ئاوێنه
خه‌م و ئازارم به‌ چــاو دی ده‌وه‌رین شابالّی
حه‌جه‌رول ئه‌سوه‌دی ئه‌و خالّه‌ی بدیبا سۆفی
قه‌ت به‌ره‌و مالّی خودای ڕانه‌ده‌خست به‌رمالّی

كۆیه‌85

" ئالآ "

له ئاسۆی روونی کازێوەی ئەوین
مەستی چیرۆکی بزەی ئەو لێوەم
دوور لە تیرێژی بەتینی چـــــاوت
سڕۆکە سیرەی سەرما و کڕێوەم
ئاسکە کچـــــانی نیشتمانەکـــەم
لە سای ئێوەیە هێشتا بەپێوەم
کانیلەیەکــــــــــی روون و زولاڵم
بەرەو ئامێزی دەریا بەرێوەم
با کڕنۆش بەرن بۆ تۆزی بەر پێت
ســـــــروەی بەهارو شەماڵ و شنە
چـــــاوت هەڵێنە و ونم کە گیانە
لـــــە نێو ئەم دەریا قووڵ بێ بنە
چـــاوی تۆ رازی عەشقی لە قاودا
نیـــــــگات ئاوێنەی ئەوینی منە
کە تۆم لێ دوور بێ نەتەنیا شێعرم

بەڵکو ناسنامەی خۆشم لـــــــیٚ ونە
شێعری بەهارە شۆرە بی باڵات
هاتووم پشوو بدەم لە بن سێبەریا
خۆری روخسارت کەعبەی ئەوینەو
دڵـــــم خول ئەخوا لە دەورو بەریا
ئیزن دە جـــــــاریٚ شنەی بەیانی
تـــــــۆزی رێگەکەت بکا بەسەریا
کە چاوی توم دی وەها نوقم بووم
هەموو جیهانم لیٚ بوو بە دەریـــــا

❊ ❊ ❊ ❊

لــــە نیشتمانی سەوزی ئەوینا
تیرێژی خۆری پیرۆزی ئـــاڵای
بــۆ ژان و خەمی شەوانی دووریم
ڕووگەی خودایـــی ڕاز و سکاڵای
تــۆ چیرۆکیچکی پر لە هێماو ڕاز
بــۆ من باشترین بیانووی موتاڵای
بەرزی هەر وەکوو ئاڵای نیشتمان
گەرچی بەڕواڵەت زۆر کورتە باڵای

**کۆیە85**

# کازیوە

بـــــزەت پەخشانێکی پڕ نێوەڕکە
دلچی سڕبووی زەمانی دا خەتۆکە
کە دەرکەوتی لە ئاسوی سەوزی کوێستان
وەرە چاوێ لە کڕنۆشی چڕۆکە

لە دووت ئاوارە بوون پەخشان و شێعـــرم

وشەی سەوزی ئەوینم بــۆ وەخۆکە

خـــــــــەم و ژانم لە دڵدا بێ ژمارن

بەڵام تەنیا خەمی عەشقت سەرۆکە

دەسی هاوارو ژانت هەڵوەراندم

ئەگەر دەکرێ پەژارەش دەستە مۆکە

دڵی بیزار لە شەو ئازاری دووریت

بە تاسەی دینی کازیوەی بەرۆکە

شەپۆلی یەکەم نیگام دی تێ گەیشتم

لە چاوتدا زرێبار یەك تنۆکە

چلۆن بێژم لەمن دووری کە عەشقت

لە خوێنمدا دەسوورشێ وەك خڕۆکە

بەراستی کۆتری مەمکت بزۆزن

لە ژێر ئەم کراسە ئاوریشەمە خزۆکە

بزەت ئیمزای خودایە :تۆ سەری خۆت

ژیانم بۆ لە دەست مردن ویتۆ کە

**1385 کۆیە**

حەیرانی زەردی هەڵوەرینی خوێند گوڵێك بە ئەسپایی

هاتبۆ بەر دەرکی بەهار  بۆ دواوتەو ماڵ ئاوایی

خەونی هەڵوەریوی باخم لە چاوی سروەدا بینی

سینگی پڕ بوو لە چیرۆکی سەوز  و ناسکی ساوایی

شینە شەپۆلی نیگایەك نەیدا لە روخساری غەزەل

بۆیە هەر لە سەر چۆپی ڕا لێم بوو  بەشێن گەڕی  شایی

تازە کانی خەونی لێڵی زریاکان لێك ناداتەوە

لە دەفتەری شەپۆلی دا نەما وشەی دڵنیایی

ئەم وەرزە هیچ پەپوولەیەك ناچێتەوە ژوانی زەریا

بەژنی بەهاری تێك شکاند  شنەیەکی لە خۆبایی

چەقۆی درۆی بۆ سەربڕینی  وادەو بەڵێنی هەڵکێشا

ڕێگاکانی خۆشەویستی گەیشتوون بە کۆتایی

پەڵەی رەشی درۆی عەشق بەسەر لاجانگی خونچەوە

شنە پێی  شەرمەزار نابێ بۆی بۆتە شتێکی ئاسایی

ئاسمانیش لە درۆزنیی تیشکی گەلاوێژ تێگەیی

بۆیە ئێستا دەست دەکاتە ئەستۆی کچی تاریکایی

وشەی پەخشان و شێعری نوێ حەز ناکەن ناوی تۆ بێنم

هەموو سەریان کردۆتە سەردێڕی رەشی بێ هیوایی

شێعر پێنووس و دەفتەر و بەهار و عەشق و پێکەنین

دەستەملانی یەکترن  بە نیازی گەردن ئازایی

83/9/28 کۆیە

## "دەریا 6"

گەر دەتزانی دڵت وەکوو
پاساری یەکی بێ هەوارە
هەر چوار وەرزی دڵۆڤانیت
سڕ و زەرد و بێ بەهارە
گەر دەتزانی جێ هەوارت
بێ ماڵ ئاوایی چۆڵ دەکەی
بە لافاوی رەشی رقت
دڵی دەریاکان لێڵ دەکەی
گەر دەتزانی تریفەی عەشقت
دوا ئەستێرەی شەوگار دەبێ
لە سەر سینگی یەکەم هەوراز
پشووی بەڵێنت سوار دەبێ
گەر دەتزانی بەچنی عەشق و
قەوڵ و وەفای کاڵ و کرچت
گشت لاواز و کورتە باڵان
وەکوو چەمی شێعری پرچت
نەدەبوایە ناوی دەریات
خستبایە سەر زاری شێعرم
با هەر تەنیا ناڵاندبای
روحی پڕ ئازاری شێعرم
نەدەبوایە وەك خوای ئەوین
خۆت ناساندبا بە هۆنراوەم
خۆت نەکردبا بە قیبلەگای
ئەم شێعرە سەرلێشێواوەم

❊❊

درەنگم زانی شنەی بزەت
بۆ سەر بڕینی گوڵ و چرۆ

وەرزی بەهار تیرۆر دەکا    بە ئایەت و سوورەی درۆ
پێم وابوو تۆ خودای عەشقی    لەم قاقڕەی ئەویندا
بەختەوەرم گەر بخنکێم    لە ناو ئەو گۆمە شینەدا
کە تۆ هاتی وشەی شێعر    کردیان بە گۆڤەند و شایی
نەپشکووتن گوڵی سڵاو    بویتە شەختەی ماڵ ئاوایی

***

پێم وابوو جوانترین شێعری    دووتوێی دەفتەر و نامیلکەی
بەراستی وەمزانی دەریای    پێم وانەبوو تراویلکەی

**بانەمەڕی 85 کۆیە**

**************************

دڵنیا بوون

دوێنی شەوێ بۆ پشوویەک حەسانەوە
پەنام بردە
نێو باوەشی شەختەو زریان
ئەودەم زانیم ئەو باوەشە گەر ساردیش بێ
لەئامێزی مەیلی ئیستات گەرمترە!
کەکازێوە سەری هەڵدا
خەمی عەشقم بە گوێی بەردی چیادا خوێند
دیتم

یەک

یەک

دەتوێنەوە

ئەودەم زانیم

بەردی چیا گەر ڕەقیش بێ

زۆر لە دڵت نەرمترە!

**1377** سەقز

## زیڕەی وشەی خۆشەویستی

وەک چۆن ئەتۆ

لە بەر چاوم

لە دارت دان

گەردنی گشت قەولەکانت

وەک چۆن ئەتۆ

بە شمشیری تیژی درۆ

سەری بەرزی سوێندەکانی خۆتت بڕی

شەرت بێ منیش لە پێش چاوت

یەکە

یەکە

ئەو وشانەی

بۆ ڕۆژانی خۆشەویستی تۆم نووسیون

## به زیرە زیڕ

له باوەشی دەفتەرم دا بێنمە دەرێ و
زیندە بە گۆڕیان کەم هەموو
شەرت بێ ئیتر
بۆ گوڵزاری بیرەوەریم
ببمە زریان
ببمە ئاور
ببمە تۆفان
دەفتەری دڵپڕی شێعریش
بدەم بە کۆڵی ڕەشەبادا
بیبا بەرەو مەرگ و نەمان
با نەمێنێ شوینەوارێک
له سەردەمی دڵداریمان.

**1377/4/3** قەڵای هۆلاکۆ

. . . . . ؟

له سه‌ر لوتکه‌ی ئاواته‌وه
له‌په‌نجه‌ره‌ی‌کۆشکی زه‌ردی خۆره‌تاوا
هاتم ده‌ستت له ئه‌ستۆی که‌م
ده‌ستی کورتم نه‌ت گه‌یشتێ
ئیدی ئێستا خاترجه‌مم
یه‌ک له یه‌کی به‌رزترن
به‌ژنی ئه‌تۆو
داری ئێش و ده‌رد و خه‌مم.

## مەرگی وەرزێر

وەرزێرێک مرد
بەڵام لەلێدان نەکەوتن
دەهۆڵ کوت و
زورناژەنی
گەڕی شایی!

کەچی کاتێ
ئەم هەواڵە گەیشتە شار
لەکلیلەکەی خۆی یاخی بوو

قوفڵی دەرگای نانەوایی.
1378 حاجی لەک

## مەرگی گەڵا

کۆرپەی کفن زەردی گەڵام
دەنێو پەنجەی
سرِی شەختە و زریانا دی.
ئیتــر دامە کڵپەی گریان.
دار پێی گوتم:
مەگری مەگری
رۆڵەی ئازیز،

دەنگی مەرگی ئێمە نەبێ کێ دەتوانێ
تابلۆی بەدنێوی و ڕوورەشی
بدات لە تەوێڵی پاییز.

**1387** حاجی لەک

## وەی شێعرەکانی ئێوە
## پێشکەش بە شاعیری ژیر کاک جەلال مەلەکشا

کە شێعرێکت
ڕەگ دەکوتێتە  دڵی خاک و
لک و پۆپی داری وشەت
دیواری سەت کۆشک و تەلار
وەک منداڵی سەرمابردوو
هەڵدەلەرزن.
من نازانم
ئەو کۆشکانە زۆر لاوازن ؟
یا هەر وەی شێعرەکانی تۆیە بەرزن ؟

# تۆفان

کەدەمهەوێ گوڵ بنووسم و
سەوز بدوێم
لەشم دەبێتە سەرچاوەی ڕووباری خوێن.
بیر لە بەهار دەکەمەوە
چەقۆی شەختە
گوڵی زمانم سەر دەبڕێ و
مێشکم دەبێتە باڵندەی بێپەڕوپۆی
سەهۆڵبەندان.
بەدەم خۆشەویستیەوە پێدەکەنم
ڕووحم دەبێتە گڕکان و
دەتوێمەوە و دەبمە
تـــــۆفــــان.

## تینوێتی

روخساری تۆ
ئاوی ڕوونی کانیاوە
[]
نیگای ماندووم
بێوچان لـێدەخواتەوە
ساڵهایە
هێشتا تینوێتی نەشکاوە.

**1381/3/17**کەرەج

# سەرگەردانی

تەمەن زەریا
ڕۆژ و حەوتە و مانگ و ساڵیش
شەپۆلەکان
ئێمەش
گەمییەکی سەرگەردان
چەند بەپەلەین
بۆ گەیشتن
بە بەستێنی مەرگ و
نەمان.

## ڕابوون

تۆ لە کوێ بووی
کە لە قوڕگی شنەبادا
حەیران بوو بە لوورەی گورگی برسی و
لەسەر سنووری زەردەپەڕ
دەستیان نایە بینەقاقای خۆریماندوو.
تۆ لە کوێ بووی
کە گیرفانی هەوریان بڕی و
چاوی بارانیان هەڵوەراند.
شەرمەزارە شەرمەزار
هەور لەلای خاکی تینوو.

[]

گەر هاتیەوە و
خەونی بەرزی هەڵفرینت وەبیر باڵندە هێناوە
لە قرمژنی سەخت ترین بەستەڵەک دا
بە فاتیحای
ئایەتێکی تیریژی خۆر زیندووم کەوە.
من دێمەوە
تا گریانێکتان هەڵپەڕم و
پێکەنینێکتان بنووسمەوە
لەڕووبەرگی ئەو دیوانە شێعرە پیرەی
لە یەکەمین کۆڵانی چاپخانەدا
زۆردەترسم چاوی بدزن.

**1381/10/19**

## پیلان

له وەتاغی پیلانێکا دانیشتووین
له نێوانمان
کەشەفێکی پڕله تەرمی بزە و بڕوا
شیرێکی ژەنگاوی لەسەر.
پپیلانەکە بۆو کەسەیە
بۆ دەربازبوون
لەو دەرگایە بڕواتە دەر.

**2/10/ 1381 حاجی لەک**

**شـــــــــەهـــیـــــد**

دریژترین قەسیدەی ژینە
سەفەر.
هەر لە ئامێزی مەرگدا دەحەسێتەوە
ژیان.
پەلەت نەبێ
شەپۆلــی قوڵترین دەریا و
گەردەلولت بۆ زین دەکەم
وەک ئەو پێنووسە دەستەمۆ.

لە دەفتەری زولاڵترین گۆرانیدا
دەتنووسمەوە و
وێنەیەکی هەمیشەییت لــێ هەڵدەگرم
لە نێو گلێنەی وشەدا و
تا هاتنەوەت
لە چلووکی چاوەڕوانیەکانمی دەدەم.
من دەمهەوێ
دوو ڕکات نوێژ
لەسەر بەرماڵی دڵۆپەخوێنێک وەخوێنم.
چرکەساتێک میوانم بە.
[]
گەڵا گەڵا
دەرفەتەکان دەژاکێن و
لەو دیوی کەل
ئەسپی کازێوە وەستاوە
چاوەڕێمن
ئەستێرەکان.
دەبێ سبەی
بەر لە ژوانی خۆر و ئاسۆ

خەونەکانم
بۆ خاک و
بۆ گوڵ و
باران بگێڕمەوە و
بەر لە ترپەی پێی پەپولە پاییزیەکان
چەپکێ سورەگوڵی موژدە
بدەمە دەست
خولیا پیرەکانی دایکم.
[]
پەلەت نەبێ
ڕۆیشتنت
زریانی پێ دڕتر دەبێ و
تاسەباریی ئاوێنەکان دەچرژێنێ.
تۆ دەڕۆیی و
ئیتر ئەوجار
بەربینگ دەگرن
بە گوڵ
بە مانگ
بەئەستێرە

چەقەڵەکانی دەوری شار.

**1381/8/16**بۆکان

..............................................................

.....

من هەوەڵ ڕۆژی ژیانم وام لەچارەی نووسرا

بۆ خەمی تۆ بێشکە بم دەسرازە بم گەڵوازە بم

## گۆرانی

بەسەر گۆنای شەقامەوە
سپیترین
وشەی یادگارین
جێپێکانی

هەر بۆیەش
لە ساڵرۆژی ئەوینمانا
کۆڵان دەست لە ملی شەقام دەکا و
دەیکەن بە شێعر و گۆرانی.

## زەماوەندی پەپوولە بێ باخچەکان

دێم
دێم و گوڵی سڵاوێ
لە قژی وشەی ئەو شێعرانە دەدەم
هەستی شەو دادەڕووشێنن
وەرە با پێش وەرزی هەڵوەرینی نیگا
دەگەڵ خەونی بێتەعبیرمان

سڵاوێ لەو دەستانە بکەین
دەنگی ناڵەی ئەمڕۆی خاک و
هەڵقرچانی کانی و شەپۆل تۆمار ئەکەن
بۆ سبەینێ
تۆ وەک قاسپەی کەوی هەڵبەستێکی کەویی
منیش ماڵم بە کۆڵمەوە

نە دەتوانم
لە گلێنەی پەخشانێکا بتشارمەوە و
نە بۆم دەکرێ بە گۆرانی .
خۆ من قاسپەی کەو و کوێستان لە بیر ناکەم
ئەگەر زستانیش تووڕە بێ.
[]
وێنەی هەموو پێکەنینەکانتم
هەڵگرتوە.
چون دەزانم زۆرجار بزە
وەک ڕووداوێکی کت و پڕ
لەسەر لێوێ برووسکە ئەدا و
ئیتر...؟

[]

بەیانیان

گۆرانی بۆ باران و

بۆ هەتاو بڵێ

با لە گوێزەبانەی یەکەم گوڵدا

بەشداری بکەن.

منیش هەموو ئێوارانە

لە زەماوەندی

پەپوولە بێباخچەکانەوە

دێمەوەلات.

تەفسیری تاڵترین ڕووداوەکانە

پێکەنین

دوایین هێزی دەسەڵاتی تۆیە

گریان.

خۆ لێشاوی سەفەری ئەم ئازارە

نە لە مندا کۆتایی دێ و

نە لە خەونی

سبەینێی مناڵەکانیشدا

خۆزگە کۆتر

خەونی تاڵ و ئاڵۆزی
نەدیتبا،
بارانیش
خەونی تینوێتی.
[]
من تۆم خۆش دەوێ و
خەڵکی وڵاتێک
چەمی چاوەڕوانیەکانیان نەشڵەقێنن
باڵندەی دارستانێکیش
بۆ لاویچی دانەوێڵە
نەبێتە فاڵگری خەڵک و
هەڵفڕینی بیرچێتەوە.

لە بیرت بێ
ئەو دڵانەی
دەنکە مووررووی خۆشەوستیان لـێ ون دەبێ
بۆگەن دەبن
ئەم چاوانەش
دەنکە هەناری ڕوانینیان دەدۆڕێنن

خۆشەویستی

چەکچەکیلەن.

لەدایک بوونی تۆ

دووپاتەی عەشقێ بوو

کە بەهانای ژینەوە هات

[]

ساڵەهایە

گۆرانی هەنگاوەکانت دەبیستێ

خاک

کەچی تامەزرۆیی ناشکێ

پڕ بە کۆشی ئاسمانێ خۆشەویستیت پێشکەش دەکەم

گەر لاوێچێ لە پەژارەت

بە شێعرەکانی من بدەی.

چوار وەرزی ساڵ نیگاکانت داببارێن

ڕێژنەی شێعریان تەواو نابێ.

تا مردن بین بە خۆشەویستیەوە بنێم

ناشکێ باڵی تینوێتیم

تۆ پەژارەی خۆشەویستی و

خوناوکەی شێعری نیگات و

گۆرانی هەنگاوەکانتم بۆ بنووسەوە
منیش
هەروا
شاعیر دەژیم.

**حاجی لەک 1381/11/5**

## بۆ سەوزبۆشێک

ئەگەر شەماڵ
لە پەنجەرەی ماڵی تۆی دا
جوابی دەوە.
ئەوساڵ باران نەباریوە و
سروشت تارای سەوزی نیە
گیا تینوە و
هێزی نیە بێتە دەرێ.
ئەمن شەماڵم ناردووە

پشتێندە کەسکەکەی پشتت
لە بۆ بووکی بەهار بەرێ

## چاوەڕوان(1)

ڕۆیشتوویی و
ئیستاش کۆڵانەکانی شار
مەستی دەنگی ترپەی پێتن
بگەرێوە
نەک هەر ئەمن
شێعر و چیرۆک و پەخشانیش

خولیای تۆن و

لە بەر دەرگای دڵۆڤانی چاوەڕێتن.

**1379** مياندواو

## چاوەڕوان(2)

هۆ فریشتە
ڕوخساری تۆ ئێستەکانێش
لە بەر چاوم جوانترین تابلۆی سروشتە.
بۆیە پاش ئەو هەموو ساڵەش
پەنجەرەی چاوی چاوەرێم
بە هومێدی گەڕانەوەت
هەروا لەسەر گازی پشتە.
بگەڕێوە
چاوەڕوانیم
پەنجەرێکی ئاوەڵایە
کلیلی پێوەدانەکەی
تەنیا لە دەست مەرگ دایە.

## 1380/8/21 میاندواو

## چاوەڕوان(3)

قژی ئاڵۆزکاوی سەفەر دادەهێنی و
هەر نەمدیتوی
لەو کاتەوە تۆم ناسیوە
دڵنیابە تا هاتنەوەت
ملوانکەی چاوەڕوانیم
بە بەژنی ڕێ و

به گەردنی پەنجەرەوە هەڵواسیوە.

**1382/2/9**

## چەند ورکە شێعری سەربەخۆ

**(1)**

هێندێ برینم بە ملەوە بوون
هێندێ زامی بەژان و سۆ
چیان لــێ بکەم؟
شەق لە مەرهەم هەڵدەدەن و
کڕنۆش دەبەن بۆ دەمی چەقۆ.

**(2)**

وەرە جوان بتڕازێنمەوە
وەکوو بووکی جەنایەتێک

له تۆ نەبێ
له هەرچی جوانە بێزارم
نەبم؟
چ ئافرەتێک له زوڵم شۆخ و شەنگ ترە؟

(3)

حەزم لێتە
سێوی تاوان
ئەی ناسنامەی مەزنێ ئادەم

(4)

دەچین له گەڵا دەپرسین
به زمانی سێو
ئێمە بەهارمان خۆشدەوێ و
گەڵاش...

ئەو ڕازە
بخەنە ماڵی شەماڵەوە
هەتا
پاییز...

# کۆچ ـ لێرەوە دەست پێ دەکا

## کۆچ (**1**)

بەیانییەک بە سکاڵای نیگای عەشق
سڵاویکت لێ کردم تۆ
توانیم جوابت نەدەمەوە.
ئەم ئێوارە
بە نیگایەک ماڵ ئاواییت لە شێعرەکانم کرد
توانیم پێنەکەنم
بەڵام نەمتوانی بە دڵ بۆت نەگریم.

**1382/7/17**قەلَای هۆلاکۆ

## کۆچ (2)

باران
سەوزایی دەچێنیّ و
نیگا راز و ڕاڤەی ئەوین.
پاییز
کۆچ و
کۆچیش
ئەسرین.

**1382/7/17**قەڵای هۆلاکۆ

# کۆچ (3)

گلەییت لێ ناکەم خۆشەویست

عەشق قورسە و

بەژنی بەڵێنی تۆ

لاواز . . .

## کۆچ (4)

رنووی پەژارەی ئەو کۆچە
بە کۆڵ مندا مەدە
ئازیز!
من هەر عەشق و هەگبەی برینم پێ هەڵدەگیرێ و
ناشڵێم
بەقەد بەڵێنییەکانی تۆ کزم
من ڕەسووڵم
پەیامهێنەری ئەو عەشقەی
کە پێکەنین
لە شاییدا دەستی نەگرت و
لە ئێوارەی
جومعەی مانگێکی ڕەزبەردا
تیرۆر کرا.
ئا . . .

ئا . . .
ئەو ئێوارەیە بوو کە تۆ
ژانی شارت بۆ چیرۆکە درێژەکەم دەگێڕاوە و
بەسەرهاتی
ئەو ماڵەی
باری کرد و هیچ کەس دڵخۆشی نەداوە
دەسرەی سەرچۆپی ئەو زەماوەندە تاریکە
مەسپێرە بە عەشقی شەهید
شەهید
ئەمانەتی پێ هەڵناگیرێ.
کورتە چیرۆکی ئەو بەهارە
بخە جانتای شەماڵەوە
ئاخر . . . .
پاییزە و
دەست لێک بەردان و . . .
هەر من دەزانم
چ تەفسیرێکی تاڵە هەڵوەرین و
هەر چڵووک دەزانێ
چ ژانێکی دڵتەزێنە

## کۆچی گەڵا.

پاییزە پاییز . . .
گەڵا و
دواین جومعەی ساڵی عەشق و
تۆ . . . .
کۆچ دەکەن و
من
ماڵ ئاوایی دەکەم
لە هەموو جومعە عاشقەکانی ساڵ.
حەز دەکەم
لە حەوتووەکانی مانگمدا
لە مانگەکانی ساڵمدا
لە ساڵەکانی ژینمدا و
لەژینمدا
هەرگیز
نێوی جومعە و
کۆچ و عەشق و
پاییز و

تۆ نەبیستمەوە.

ماڵ ئاوا

ئەی نێوەڕۆکی شێعرەکانی

«77»ی من

ماڵ ئاوا!

## 1382/7/17قەڵای هۆلاکۆ

## ئەم سەفەرە بێ سنوورترین ئاهەنگە

ئازار نەبێ ئەو شارە هەموو سەفەرین

دەڵێی:

سەرەتایی ژیان و ناسنامەی هەموو عەشقێکە

سەفەر.

لێرە سلاوێك لە شەو باشی هەموو ساتێکمدا هەڵدەوەرێ

تکایە

تکا

لەو خەمە مەزنانە

کێو و باران بێ بەش مەکە ...

ئەم سەفەرە سوێرە سوێر

له ماڵ ئاوایی تۆقیوم

لێره ...

له هەڵوەرینی ماچ و کاڵ بوونەوەی سڵاوو ئاوابوونی

شێعردا

بارانێکی خەست دەخوێنمەوە ...

شێعرێکی سوور دەبارێنم

سیەکانم پڕ دەکەم له کۆچ ...

ئێمه هەزاران جار وتمان :

شارو شەقام بێ دەسنوێژن ...

تێناگەی ...نا

لێره سەفەر چرۆدەکاو کۆچ دەپشکوێ و

چاوەڕوانی باڵا دەکا...

تۆ لەزەردە پەڕێکی بێ پەپوولەدا سەفەر دەڕوێنی و

تا هاتنەوەت دەبێ

له سێبەری ئەم سەفەرەدا بێ ئۆقرەبم ...

دەبێ له ئێوارەیەکی بێ سڵاو بێ باراندا

عەشقێ دابڕێژم

کیشوەری ماچێ داگیر کەم

که بتوانم ئاڵای سڵاوێ هەڵکەم و

لە دایك بم ...
ئێمە وتمان :
باران غەریبترین موسافیرە بۆیە
سەفەر سلاو دەوەرێنیٚ...
وەرە دلٚخۆشی ئەم بارانە بدەینەوە ،
لە پەپوولە نیگای ئەم شەقامەدا
گویٚ لە تەنیاییم ناگریٚ.
تکا دەکەم
دەست مەنیٚ نێو دەستی سەفەر
سەفەر لە بەیانیەی دووشەممەیەکی سوێردا
بزەی گەشی دایکمی دزی .
کەزیەی کۆچ و مالٚ ئاوایی دامەهێنە
لۆرییەکانی ئەم شارە هەموو رۆژیٚ
کاروان کاروان بزەی مردوو فریٚ دەدەن.
دە گەلٚ هەموو ئێوارەیەکی ئەو شارە دلٚپڕم
دلٚپڕم لەو مردووانەی
شەقامیان لە بۆگەنیوی هات و چۆیەکی بیٚ هوودە ئاخنی.
دلٚپڕم
لەو ژنانەی نیگایان بە تالان دەچیٚ .

هەموو ئێوارەیەکی ئەو شارە وێرانم

وێران

وێرانم وەك عەشق

وەك دلۆڤانی و

غەریبم وەك خۆشەویستی .

ئەریٚ کاکە ...

عەشق؟

قاقا پێدەکەنیٚ و دەڵیٚ :

لە چیمەنتۆی خانوویەکی سێزدە قات دا

بوو بە پەنجەرەیەکی کوێر .

تۆ گووتت:

ئەم خانووە

کۆشکی سیاسەتە ...سیاسەت.

دەڵێم :

مەرگ:

دەست دەخاتە گیرفانەکانی شەقام و

لوێچ لوێچ بۆمان هەڵدەرێژیٚ .

دەڵێم کاکە :

تا سەفەر بیٚ

هەموو ئێوارەیەکی ئەو شارە عاشقم.

تۆش یەکەم ناسنامەی سەفەر ئیمزا دەکەی

لە ئێوارەیەکی پەرەسێلکەدا

چاوی کۆلان

پڕپڕ دەکەی لە چاوەڕوانی و فرمێسك ...

هێشتا باران ماڵی ئێمەی نەدەزانی

کە تۆ سوژدەت بۆ سەفەر برد

چ ماچێکی شوومە سەفەر

هەموو شەقامی ئەو شارە

تینووی دڵۆپێك ترپەی پێڵاوی تۆن

تۆش

لە ئێوارەیەکی غەریبدا دڵی شەو و شار

شەق دەکەی

نەگوێ لە دوایین سکاڵای کۆتر دەگری و

نە فاتیحایەك لە سەر گڵکۆی گۆڕ غەریبێ

تۆ پێت وایە

کۆتر بێ ئاسمانترین باڵندەیەو

شەهیدیش...

تا پڕ بوونی گیرفانی سەرکردەیەکی بەدفەڕ

دەژی...

دەڵێم :

بڕوات هەبێ ئاسمان بۆ کۆتر و

زەمان بۆ شەهید دەستەمۆن

دەزانم :

بە فەلسەفەی هیچ شێعرێك و

بە سکاڵای هیچ عێرفانێك نایە ڕەدا

بەر لەوەی کۆچ هەنگاوت بخوێنێتەوە دەمزانی ...

لە ئێوارەیەك دا دەڕۆی

دەستمان سێبەری چاومانەو

لە سینگی لێڵی ئاسۆ دا خەوهنی مانگ لێك دەدەینەوە

دەزانم:

ئەم ئێوارەی جێم دەهێڵی

نە هەور دڵۆپێك گۆرانی بارانی لە بیر دەبێ و

نە کۆتر سەربەندی حەیرانی فڕین

ئەو ئێوارەی سەفەر دەکەی

لە دوایین وێستگەی خەمەکانی ئەو شارە دا ڕادەوەستم

ئەگەر هاتی :

نیگایەکتم بە یادگار پێ بسپێرە

به تۆوه

تا دوایین سنووری سەفەر عاشقم

رەشەمەی **82** بۆکان

ئێمە لە گەڵ "نا"باریوین

سەرەتا...درۆ

کۆتاییش ...

کێڵگەیەك لە نێوان ئەم سەرەتاو

کۆتایی یەدا

کەراستی تێیدا شین نابێ

کە راستی

لەوەرزی هیچ زەوی و

بە کێڵگەی هیچ وەرزێك دا نەباری

ژیان

بەتراویلکەی سەداقەتەوە سەرقاڵ

پێکەنین

بە رەنگی زەردی دزراوەوە

نەخشین

ژیکەڵەترین نیگا

ئەو نیگایەی دڕکە جاڕی دەخوێندەوە

هاتین بە شەقامێکی بۆگەن دا

مەست

لەدرۆ

لەبۆگەنیو

بەختەوەرین ئەو کەسانەی

هەرگیز هۆگری چرا نەبوون

گزە ژیکەلانەکانمان وەهایان وەسوەسە کردین

کە جێ ژوانمان

پڕ کرد لە شەرمی سەداقەت

تاسە باران

قەدری شەو بگرن

تەنانەت لە بەر خاتری ئەستێرەش بێ

وەرن بە ئەسپایی

ئێستا

هەر شووشە چرژاوەکەی ڕابردوویەو

کۆلانەکان

لە شەقام بێ دەستنوێژترن

بەلام ئەو دەم

به چاویلکه چاومان له باخچه نه‌ده‌کرد
به میکرۆفۆن
په‌پووله تاوانباره‌کانمان نه‌ده‌دواند
ئه‌و ده‌م به خه‌نجه‌ری به‌ر پشتوێنمان
گوڵمان له به‌رۆکی خه‌ون ده‌دا
ئێستا به قاسپه‌ی سووری تفه‌نگ
لاووك بۆ خونچه‌کان ده‌ڵێین
تۆش ...
حه‌ز ناکه‌ی سێبه‌ری ئه‌م ره‌شماڵه به‌جێ بێڵی
منیش
واز ناهێنم
له گاوانیی ره‌شبه‌ڵه‌کی ئوستووره‌کان
له سێبه‌ری ئه‌م ره‌شماڵه پیرۆزه‌دا
هیچ که‌س نابێ
بوختان بۆ درۆیی موقه‌ده‌سمان
هه‌ڵ به‌ستێ
درۆ
کچێنیی خۆی
له باوه‌شی بزه و به‌ڵێنی و شه‌راب دا

بە ئێمەدا

هاتین

بۆ نووسینەوەی سەر لە نوێی سەرەتاکان

تینوو تر لە جاران

بە درۆ و

تاسەبارتر بە گزەو

ڕق ئەستوورتر لە ڕاستی

❋❋

ئێمە دەگەڵ "نا " باریوین

نا

بۆ خۆمان

بۆ

ژ

ی

ا

ن

ئێمە ئەوەندە سەر خۆشین

بە شیوەنیش هەڵ دەپەڕین

من لەو شەقامە بەختەوەرانەوە دەڕوانم

که چاوی ڕەش هیچ پەنجەرەیەك

نایانبینیٚ

تۆش بە کۆلانێك دا وەرە هەرگیز

خەونی مانگی نەدیتبیٚ

ئەستێرەی قەت نەدواندبیٚ

دەنا تۆش تاوان بار

دەمری

من لە تاوان نادوێم

چ بکەم ؟

تاوان تابلۆی یەکەم شەقامی هەناسەی ئێمەیە

هەتا چاو بڕ دەکا...ڕەش ...ڕەش

ئەگەر هاتی لەسەر دووریێیانی

درۆ و ڕاستی

نوسراوە:تاوانبارانی خۆشەویست

ڕاست ------ چەپ

تۆ ڕاست بەرەو لای چەپ وەرە

با لە شەتاوی زولاڵی گوناحدا

نوقمی ئەو تاوانە شیرنانە بی

کە ئێمە ...

